خۆرو لاولاو/ ئەمین گەردیگلانی- نیگارەکان تەهای سۆفی رەحیمی
عنوان به فارسی: خورشید و پیچک
فهرست نویسی بر اساس فیپا – کردی
شعر کردی ۱-گردیگلانی امین ۲- طەصوفی رحیمی- تصویر گر
۲۲/۸ فا ۸
۴۳۲۸-۸۵م
ISBN ٩٦٤-٨٣٣٨-٤٤-٩

شابک ۹-۴۴-۸۳۳۸-۹۶۴

# خۆر و لاولاو

ئەمین گەردیگلانی

شێعری منداڵان

وێنەکان: تەها سۆفی رەحیمی

پیتچنینو رازاندنەوە: چاپخانەی داهاتوو- بۆکان

چاپی یەکەم: بەهاری ١٣٨٦

ئەژمار: ١٠٠٠دانە

به ناوى خودا

**بـۆ**

**« هێمن و هیـوا»**

**گوڵاڵەکانی باخی ژیانم**

# ناوەرۆک

# کــۆتــر

لەبەر هەیوانی ماڵمان
کۆترێکی خنجیلانە
تۆزێ پووشی هێناوە
سازی کردووە هێلانە

بەیانیان بە گمەگم
لە خەو هەڵم دەستێنێ
داوای دان و ئاو دەکا
بۆیە ئاوا دەخوێنێ

دان و ئاوی بۆ دەبەم

دێت و دەنیشێتەوە

وەختێکی دەچم بۆ لای

خێرا هەڵدەفڕێتەوە

خۆ من زۆرم خۆش دەوێ

خۆزگە بیزانیبایە

ئەمجارە کە چووم بۆ لای

ئیتر هەڵنەفڕیبایە

# پشیـله

پشیلەی جوانی خاڵ خاڵ
تووک نەرم و نۆڵی چاوکاڵ

گوێ کورت و سمێڵ قیتی
وریا و بە هۆش و زیتی

خۆشە میاوە میاوت
جوانە بریقەی چاوت

بە ڕۆژ هەتا ئێواران
لەبن دارو دیواران

خۆت مات دەدەی لە مشکان
لە جووجەڵەی مریشکان

دایم خەریکی ڕاوی
سمێڵ قیتی فێڵاوی

# کاژیلە

بەع و بەع و بەعیلە
بەمن دەڵێن کاژیلە

گوێچکەم خاڵ خاڵ و جوانە
رادەکەم لەو کۆڵانە

لەگەڵ ئارام و سارا
دەچم بۆ دەشت و سەحرا

لە مێرگ و سەوزەڵانی
لە گوێ جۆگە و سەرکانی

دەکەین «قلانە قریوە
هاوینە وەختی جیوە»
ئارام بەدار لێم دەدا
سارا ئاوم پێدەدا

# خـۆر و لاولاو

بەر لەوەی بزەی گەرمی خۆر
لە لێوی ئاسۆ دەرکەوێ
لاو لاوی بنەوشی حەوشە
بە پۆل هەڵدەستن لە خەوێ

لەباوەشی تاریکیدا
گەشاوە و تەڕ و پاراون
کاتێ خۆر هەڵدێ سیس دەبن
پێموا لە هەتاو ترساون

خۆ من لاو لاو نیم، قوتابیم
خۆر و بەیانیم پێجوانە
لەگەڵ هەتاو ڕێدەکەوم
بەرە و دەرکی قوتابخانە

دوێنێ مامۆستا پێی گوتین:
«ئێوە گوڵاڵەی پاراون
هەموو خونچەی نەپشکووتوون
چاوەڕوانی خۆرە تاون»

بەڵام گوڵی لاو لاو نابین
قسەی مامۆستاشمان جوانە
گوڵ سیس دەبێ، ئێمە خۆرین
وڵات چاوی لە ڕێمانە

# باپیرە

من منداڵێکی ژیرم
خۆشم دەوێ باپیرم

لە مەدرەسە دێمەوە
لای ئەو دەحەسێمەوە

چایی و ئاوی بۆ دێنم
قەت دڵی نایەشێنم

دەمبا بۆ پارکی شاری
بۆ شوێنی کایە و یاری

## ئەمین گەردیگلانی ١٥

هەقلی مەقۆ و دیلانێ
خلیسکێن و جۆلانێ
چەرخ و فەلەک، کۆلارە
سواری ئەسپ و تەیارە

حەوزی تۆپ و خۆشارکێ
غاغارێن و هەڵپەڕکێ
لەڕێگا دەستم دەگرێ
شتی خۆشم بۆ دەکڕێ
من منداڵێکی ژیرم
خۆشم دەوێ باپیرم

# كۆلكەزێڕینە

كاتێ باران دەبارێ و
دەرک و بان دەشواتەوە
دارەکەی نێو حەوشەمان
تێر تێر ئاو دەخواتەوە

لەبن گەڵاکانیدا
چۆلەکە دەجریوێنێ
کاتێ خۆر لەبن هەورا
بەحاڵ سەری دەردێنێ

باران خۆش دەکاتەوە

گەڵا بریقەیان دێ

دێنەوەدەر بۆ کایە

هەموو منداڵانی دێ

---

لەم بەر تا ئەو بەری دێ

کۆلکەزێڕینە دەکشێ

ڕەنگی زەرد و سەوز و سوور

بنەوش و شین دەدرەوشێ

-----

تەیری تیژ باڵ و کۆتر

دەفڕن بەدەور و بەریا

باڵیان دەدەن لە ڕەنگ و

هەڵدەسووڕێن بەسەریا

------

## ١٨ خۆر و لاولاو

خۆش بوو وەک ئەو مەلانە
منیش باڵم هەبوایە
بچوایەم لەو ڕەنگانە
پڕ کۆشێکم بێنایە

«.....»

وەک پەڵەهەوری ئاسمان

نەرم و نیان و بۆشە

بۆ خەوتن و پشوودان

خودایە چەندە خۆشە

دایکم بەرگێکی جوانی

لە بازاڕ بۆ کڕیوە

ئەو بەرگە ڕەنگاوڕەنگەی

پڕ بە بەری بڕیوە

باخێکی سەوز و خۆشە

پڕ لەگوڵی زەرد و شین

کە، سەرمی دەنێمە سەر

دەبینم خەونی شیرین

# بــاران

خرمە خرمی پێی باران
دێ لە سەربانیماڵان
هەڵدەپەڕن دڵۆپە
وەکوو کایەی مناڵان

چەترەکەم هەڵدەگرم و
ڕادەکەم بۆ بەر دەرکێ
لەگەڵ دەنگی بارانە
دەست دەکەم بە هەڵپەڕکێ

بەپڕتاو دێنە خوارێ
سەردەدەن بە گۆلاوا
تۆقلە هەڵدەتۆقێن و
ڕادەکەن بەسەر ئاوا

بارانە هەر دەبارێ و
دەدرێ لە تۆقلە ئاوان
فوودانەیان دەتۆقێ
ئاوی لێڵی گۆلاوان

مۆسیقای نەرمی باران
هەوای سەوزی ژیانە
بۆ تووی لەخاکا خەوتوو
مزگێنیی سەرهەڵدانە

## ٢٢ خۆر و لاولاو

بە لێزمە دێتە خوارێ

چەن خۆشە خرمە خرمی

هەور دەدا برووسکە

پێم خۆشە گرمە گرمی

# پەپوولە

پەپوولە جوانەی باڵ و پەڕ زێڕین
دەنیشی لەسەر گوڵاڵەی ڕەنگین

سەربالەکانت جوان و نەخشاوە
ئەو هەموو ڕەنگەت لە کوێ هێناوە

منیش وەکوو تۆ باخم پێجوانە
دار و گوڵ و گیای شاخم پێ جوانە

**٢٤ خۆر و لاولاو**

چی دەبوو منیش باڵم ببوایە
تێر تێر لەگەڵ تۆ هەڵفڕیمایە

پەپوولە جوانەی باڵ زەردی خاڵ خاڵ
وەرە پێکەوە ببین بە هاواڵ

منیش وەکوو تۆ ئازارم نییە
بە ڕۆژ و بە شەو قەرارم نییە

پێکەوە دەژیین لەباخ و لەماڵ
بۆ هاوڕێ باشن پەپوولە ومناڵ

# «پایز»

کاتێ هاوین بەسەردەچێ
پایز جێگای دەگرێتەوە
بای سرِ دێت و رەنگی سەوزی
دارستان کاڵ دەبێتەوە

------------

پایز دەفتەرێکی زەردە
دارستان لاپەرِەکانی
دەرِازێتەوە بە گەڵای
زەرد و سوور و ئەرخەوانی

------------

**٢٦ خۆر و لاولاو**

لە پڕ گێژەڵووکەیەک دێ

وەکوو منداڵێکی لاسار

دەفتەرەکە دەدڕێنێ

پەڕەکانی دەخاتە خوار

------------

هەور ئاسمان دادەپۆشێ

بە توورەیی دەگرمێنێ

بارانە دادەبارێت و

لاپەڕەکان دەخووسێنێ

------------

بەفر قەڵەمسڕی سپی

بەدەستەوە دەگرێتەوە

زەردی و رەشایی سەرپەڕەی

دەفتەرەکە دەسڕێتەوە

## «کۆلکەزێڕینە»

کۆلکەزێڕینەی حەورەنگی جوان و ڕازاوە
پێم بڵێ ئەو هەموو ڕەنگەت لە کوێ هێناوە؟

بووی بە پردی پەڕینەوەی مەل و پەپوولە
خۆشیان دەوێی منداڵانی گەورە و چکوولە

من دەزانم تۆ بۆ هێندە ڕازاوە و جوانی
ئەتۆ کچی قژ زێڕینی خۆر و بارانی

## ٢٨ خۆر و لاولاو

دەڵێم خۆزگە دوور نەبوایەی ئەوەندە لێمان
پڕ دەفتەرێ لەو ڕەنگانەت بدایە پێمان

ئەمسا دادەنیشتین من و ڕۆژین و کاوە
وێنەی بەهاری کوردستانمان دەکێشاوە

# «قەڵەمڕەنگیساڵ»

سروشت دەفتەرێکی سپیی
بۆ زەوی هێنا بەدیاری
زەوی دای بە کوڕی نەورۆز
ئەویش دەستی کرد بە یاری

بەستەی قەڵەمڕەنگی تازەی
دەرهێنا لە جانتای بەهار
ڕەنگاندی دەفتەری سپی
بە چیمەن و گوڵ و گوڵزار

بەهار تاقەتی بە سەرچوو
قەڵەمڕەنگیدا بە هاوین
ئەویش بێستان و باخانی
پڕ کردن لە میوەی شیرین

**٣٠ خۆر و لاولاو**

خۆرێکی گەشی کێشاوە
بە ئاسمانی سامالەوە
شیلەی کردە دەمی ترێ و
هە نار و پرتەقالەوە

لەبن سێبەری دارێکا
هاوین وێنەی دەکێشاوە
قەلەمڕەنگەکانی بیر چوو
ئێوارە بۆ مالْ گەڕاوە

هات لەگەلْ گێژەلۆوکەیەک
پایز بەگیانی خۆلاوی
قەلەمڕەنگەکانی هەلگرت
زەرد و سووری تێهەلساوی

پەڕەی دەفتەرەکەی هەموو
ڕەنگ کردەوە زۆر بە جوانی
بەڵام هەمووی کردە ڕەنگی
زەرد و سوور و ئەرخەوانی

پایز دەفتەرەکەی دانا
تەواو بوون قەڵەمڕەنگەکان
گژەبایەک هات ڕرفاندی
خستیە ماڵی پوورە زستان

بەفری کچی پوورە زستان
هەڵیداوە پەڕەکانی
بە قەڵەمسڕێکی سپی
پاکی کردنەوە بە جوانی

## ٣٢ خۆر و لاولاو

کوتی: « دایە هەڵیگرە
بیپارێزە لەخۆڵ و تۆز
ڕێگا خۆش بێ دەیبەمەوە
بۆ کوڕەکەی مامە نەورۆز. »

سەرما ڕۆیی، بەفرە خاتوون
زوو دەفتەرەکەی بردەوە
کوڕی نەورۆز شاد و دڵخۆش
دەستی بە یاری کردەوە

# بۆیاغ

هەموو ڕۆژێ بەیانی
لەگەڵ بابم هەڵدەستم
توورەکەی بۆری فلّچەو
بۆیاغ دەگرمە دەستم

دەچم دەسووڕێمەوە
بەکۆڵان و شەقاما
چاوم لەلاقی خەڵکە
دێن و دەڕۆن بە لاما

## ٣٤ خۆر و لاولاو

هەر کەس دێت و ڕادەبڕێ
چاودەکەم لە پێڵاوی
دڵخۆش دەبم، دەبینم
کەوشی پیس و خۆڵاوی

خێرا دەنگم هەڵدێنم:
«بۆیاغ دەکەم بەهەرزان
پێت جوان نەبوو لەپێی کە
پووڵی ناوێ کاکەگیان»

ئێوارە و تاریکانە
داشقە بە ڕیز دەوەستن
سێوو هەنار و هەرمێ و
پرتەقاڵ ڕیز دەبەستن

چاویان پێدا دەگێڕم
خودایە چەندە خۆشن
پوولی کیلۆم پێنییە
بەدانەش نایفرۆشن

دەڕۆمەوە بۆ ماڵێ
بە ماندوویی و بێحاڵی
دوای من باوکم دێتەوە
بە داشقە و دەستی خاڵی

پووڵەکانمی پێدەدەم
دەستی بە سەرما دێنێ
ڕوودەکاتە دیوار و
شانی هەڵدەتەکێنێ

### ٣٦ خۆر و لاولاو

شان و پشتی خۆڵاویی
بەکار کردن چەماوە
چاوی تەڕی دەبینم
کە ڕوو دەکا بەملاوە

چاوی پڕ لە فرمێسکە
هەناسە هەڵدەکێشێ
من و خوشکم دەیشێلین
هەمیشە پشتی دێشێ

دەنگی نووساوی دایکم
دێ لەو دیوی درگاوە
شەوێ میوانمان دەبێ
ڕۆڵە میوەت هێناوە!؟